# بانگەشەی (اللە)

# لە قورئاندا

# بۆ خاوە ن نامەکان

# لە(جولەکە و گاور).

ئامادەکردنی: باوکی ئەسماء

17ی صفری ساڵی 1432 ی کۆچی
بەرامبەر
2011 / 1 /21

بسم الله الرحمن الرحيم

**پێشه کی:**

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له. واشهد أن لا اله الا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله .

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُون﴾.

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَ لُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾.

**أما بعد:**

پاش سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ خوای تاك و پاك و بێ هاوتا و خاوەنی بوونەوەر درودوو سڵاوی خوا لەسەر پێغەمبەری خۆشەویستمان(محمد) ﷺ و یارو یاوەرانی بێت تا ڕۆژی دوایی له پاشان دا:

لە ژێر ناونیشانی ئەی خاوە ن نامەکان لە ( جولەکە و گاور) وە رن شوێنی قورئان بکەون بەو بانگەشە جوانەی کە خوای پەروەردگاری جیهانییان بانگتان دەکات

لەقورئانی پیرۆزدا ، بێگومان هەموو لایەك چاك دەزانین بە هاتنی قورئان هەرچی پەیامی ئاسمانی پێشووە وەك (تەورات و ئینجیل) سڕاونە تەوە و پێویستە سەرجەم خەڵکی بێنە سەر ڕێبازی ڕاستەقینەی ئیسلام کە کۆتا پەیامی خوایی یە لەسەر زەوی دا و هەموو ڕێچکەو ڕێگاکانی تر مایە پوچ و زە رە رمەندی دونیاو دوارۆژە بە پێی ئایەتی : وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ (آلعمران:٨٥) واتە:هەرکەسێ بێجگە لەبەرنامەو شەریعەتی ئیسلام هەردینێك بۆخۆی هەڵبژێرێ و بیکا بەبەرنامەی خۆی هەرگیز لێیوەرناگیردرێ و لەدوارۆژیشدا لەڕیزی زیانمەندانە.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ناکرێت لەو کەسانەی کە خاوەنی کتێبن و لەسەر ئاینی خۆیان دەمێننەوە وەك خوای گەورە دەفەرموویێت: لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ۖ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ ۚ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انْفِصَامَ لَهَا ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (البقرة:٢٥٦)

لەئیسلامدا خۆسەپاندن نی یە:

لەم دینی ئیسلامەدا داسەپاندن و ناچارکردن و زەبرو زەنگ نیە بۆدینداریی و وەرگرتنی ئایینی ئیسلام ، بەڵێ حوکمی ئەم ئایەتە تەنها خاوەن کتێب و خاوەن نامەکان ئەگرێتەوەو، مەنسوخ و سڕاوەیش نییە، واتە: هەر جوولەکە وگاور سەر ناخرێتە سەریان بۆ ئیسلامبوون. چونکە بێگومانە کەرێگای چاك و راست لە رێگای ناڕاست و کوفرو توولە رێگاکان لێك جیاکراوەتەوە و ئاشکراو نمایانە، جا لەبەر ئەوە نایەوێ زۆر لە هیچ کەسێك بکرێت بۆ ئیسلام بوون و هەر کەسەش بەمەیلی خۆیەتی ئینجا هەرکەسێك باوەڕی بە "تاغوت" نەبێت، دیارە تاغووت ئەو کەسەیە کە لە سنووری خوا دەرچێ و، بەرنامە چەوتەکان قبووڵ کا، جا هەرکەس خۆی لەو جۆرە شتانە دوورگرت و باوەڕی بەخوا هێنا ا ئەوە بێگومانە دەستی بە هەنگڵ و بەهۆکارێکی پتەوو قایمەوە گرتووە کە هەرگیز هەڵناوەشێت و پسان و پچڕانیشی بۆنییە وە خوای گەورەیش بیسەرو زانایە.

هەر بۆیە زانایان دە فەرموون: (مەجوس) و (سائیبی )یەکانیش، لەمەدا حوکمی جوولوکەو گاوریان هەیە، واتە: ئەمانیش هیچ جۆرە زۆرێکیان لێناکرێ بۆ وەرگرتنی

دینی ئیسلام، بەڵکو هەر لەسەردینی خۆیان" ئەگەرپێیان خۆش بوو" دەمێننەوەو، سەرانەیان لێ ئەسەنرێ، بەڵام خەڵکانی تری بتپەرست و هاوەبەشدانەرو هەرجۆرە بێ دینێکی تر لەو بابەتە " هەتا ئەو رۆژە باوەڕ دێنن" دەبێ جەنگیان لەگەڵ بکرێ ئەگەر توانراو بەرژەوەندی تێدابوو.

هەموو یاساو دەستورێکی ئیسلامی پیرۆز راست و هەقە، ئیتر بێجگە لەو ، گشت دەستورو بەرنامەیەکی تر ناراست وگومراییە. دەبێ پێش ئیمان و باوەرهێنان بەخوای گەورە، دەبێ بەتەواویی لەگشت تاغووتەکانەوە دوور بکەوی ،

خۆدیارە واتای ( لا اله إلا الله ) یش بۆیەکەمجار نەفیی و لادانی هەموو دەسەڵاتدارە ملهوورەکان وتاغوتەکانی دنیایەو، پاشانیش تەسلیم بوون و باوەرهێنانە بەخوای تاك وتەنیا.

شیاوی باسیشە لەسەردەمی جاهیلیەتدا هەر ئەو بتەی وا دەیان پەرست پێیان دەگووت: ( طاغیە ).

بە پێویستم زانی وەك ئەرکێکی قیامەتی و ئەو بەرپرسیاریەتی یە سەختەی کە ئێستا لەسەر شانمە بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکانی دوارۆژم لە زەوی لێپرسینەوەدا و بەهۆی ئەوەی کەوا ژیان و گوزەران لە ناو وولاتێکدا بەسەر دەبەم کەوا زۆربەی دانیشتوانەکەی (گاورن) هەستام بە

کۆکردنەوەی ئەو ئایەتە پیرۆزانەی که بانگەشەی خاوەن نامەکان دەکات که ژمارەیان 12 ئایەتە بەو هیوایەی خوای پەروەردگار بیکاتە تویێشوی قیامەتم و ڕزگارم بکات لە سزای دۆزەخ و ڕێ نیشاندەرێکیش بێت بۆ کەسانێك کە بەدوای ڕێگای ڕاستدا دەگەڕێن وە داواکارم لەخوای گەورە پاداشتی خێری مامۆستای کۆچکردوو مامۆستا ئەحمەدی کاکە مەحموود بداتەوە بەهۆی سوود وەرگرتنم لە (تەفسیری ڕامان) بۆ تەفسیری ئایەتەکان چونکە من کەسێکم بۆ خۆم شارەزا نیم لە زمانی عەرەبی دا تەنهاو تەنها وەك بانگخوازێکی ئەهلی نقڵ پەروەردەی دەستی زانا بەشەرەفەکانی کووردستانم خوا بەرەکەت بخاتە نێو زانست و زانیاریمانەوە و ئەوی پێکابێتمان لە خوای گەورەیەو هەڵەکانیش منی تاوانبارم خوا بە بەزەیی خۆیی هەڵەکانم بۆ راست بکاتەوەو لێمان خۆش بێت.

لە کۆتایی ئەم پێشەکی یەدا داوام وایە لە سەرجەم ئەو نوسەرە خەم خۆرانەی ئیسلام کە توانای وەرگێڕانی زمانی کووردی یان هەیە بۆ زمانەکانی دیکەی بێگانە ئەم پەیامە ئاسمانی یە وەربگێڕن بۆ ئەوەی لە پاش مردنیش ببێتە توێشوی یەکی نەبڕاوەی قیامەتی .

ئەو ئایەتەی كە ببووە سەردێڕی نامەكانی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەكاتی ناردنی نامە بۆ پاشاو میره كانی خاوەن كتێب:

١. ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ ۚ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ (آل‌عمران:٦٤)

ئەی پێغەمبەر! (صلی الله علیه وسلم) بەخاوەن نامەكان بڵێ: وەرن با ئێمەو ئێوە لەسەر و شەو بەرنامەیەك سووربین كە بۆ هەردوولامان چوون یەكەو یەكسانەو، پەیامبەرانیش هەموو هاودەنگ بوون لەسەری و، واز لەو تەفرەقەیە بێنن وەرن با جگە لەخوا كەسێكی تر نەپەرستین و، هیچ شتێكیش نەكەینە شەریك و هاوبەشی هەندێكیشمان لەباتی خوا نەكەینە خواو بپەرسترێن، واتە: لەنافەرمانی خوا گوێ بیستی یەكدی نەبین، جوولەكە عوزەیریان بەخوا دادەناو، گاورەكانیش عیسا! ئینجا ئەگەر هەر روویان لەوقسە راستەیە وەرگێڕاو بۆ یەكتاپەرستیی نەهاتن بەدەمتانەوە، بەراشكاوی پێیان بڵێن: دەسا ئێوە بەشایەت بن و بزانن كە بەڕاستیی ئێمە موسڵمان و ملكەچی بڕیارەكانی خواین و،

سووریشین لەسەر دینی خۆمان و، خواش تاك و تەنیایەو، ئیتر نه عوزەیر خوایەو، نەعیسایش.

ئەهلی كیتاب له بارەی دینی (ئیبراهیم)ـەوه قسه دەكەن:

٢. ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَاجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ وَمَا أُنْزِلَتِ التَّوْرَاةُ وَالْإِنْجِيلُ إِلَّا مِنْ بَعْدِهِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ (آلعمران:٦٥)

ئەی خاوەن نامەكان! ئێوه بۆچی لەبارەی ئیبراهیمەوه بەناهەق دەدوێن و، هەریەكەتان وا قسه دەكەن كه ئیبراهیم لەسەر دینی ئەوبێ؟! خۆ دەشزانن كه تەورات و ئینجیل زۆر لەپاش ئیبراهیمەوه نێردراون ،دەسا بۆچی لەوقسانەی دەیانكەن تێنا فكرێن ؟ خۆ ئیبراهیم بەر لەموساو عیسا بووه.

بێباوەڕی خاوەن نامەکان بەرامبەر ئایەت و نیشانەکانی خوای گەورە:

٣. ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَأَنْتُمْ تَشْهَدُونَ ﴾ (آلعمران: ٧٠)

ئەی خاوەن نامەکان! بۆچی بڕواتان بەئایەت و نیشانەکانی خوا بێ باوەڕدەبن ؟ خۆ هەموو بەڵگەن بۆڕاستی پێغەمبەر بۆخۆشتان شایەتن و ئەزانن کەئەو ئایەتانە راست و دروستن.

---

خاوەن نامەکان و شاردنەوەی ڕاستی و بەدرۆخستنەوەی پەیامی خوا:

٤. [يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ] (آلعمران:٧١)

ئەی خاوەن نامەکان! بۆچی بەرگی باتڵ و ناهەق ئەکەنە بەرهەق و راستیەکانی پێدەشارنەوەو خەڵکی چەواشە دەکەن؟ لەکاتێکدا خۆیشتان چاك ئەزانن کە کامە هەقەو, کامەش ناهەق .

---

خاوەن نامەکان لە دینی خوا لایاندا:

٥. ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ شَهِيدٌ عَلَى مَا تَعْمَلُونَ﴾ (آلعمران:٩٨)

ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم) بە خاوەن نامەکان بڵێ: بۆچی ئێوە بە ئایەتەکانی خوا - کە بەڵگەی راستیی پەیامبەرن- کافر و بێ باوەڕن؟ و خوا لەسەر هەموو کاروکردەوەیەکتان شایەدو ئاگادارە، ناترسن لەخوایەکی ئاوا قارتان لێبگرێ؟ .

---

خاوەن نامەکان و ڕێگە گرتن لە باوەڕداران لە شوێنکەوتنی ڕێگای راست:

٦. ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ آمَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنْتُمْ شُهَدَاءُ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (آلعمران:٩٩)

ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)پێیان بڵێ: بۆچی ئێوەی خاوەن نامە، ڕێی خوا لە باوەڕدارەکان دەگرن و، ناهێڵن بکەونە شوێنی ڕێگاکەی و، ڕیبازەکەی دادەخەن لێیان ئەتانەوێ بەلارو خێچی نیشانی خەڵکی بدەن و، ئەو

موسڵمانانەشی لێ پەشیمان بکەنەوه باوەڕیان پێهێناوه، بۆیه دەتانەوێ هەردەم سیفەتەکانی پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) که له تەوراتدا هەن، بگۆڕن و راست و ناڕاست ئاوێته بکەن و بۆخۆشتان چاك ئەزانن و شایەتن کەهەر ئەورێگایه موحەممەدی (صلی الله علیه وسلم) لەسەره، ڕاست و دروستەو، سەرجەم بەرنامەو ڕێچکەکانی تر گشت باتڵ و ناهەقن.

(سەدیی ) دەفەرمووێت: ئەگەر لێیان پرسیبان: ئایا ناووسیفەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لەتەوراتدا هەیه؟ ئەیانوت: نەخێر، شتی وانییه ! بۆئەوه مەردم لەودینه تازه یه بتەکێننەوه. دڵنیاشبن هەرگیز خوا غافڵ و بێ ئاگا نییه لەوکاره چەوتانه ئێوه ئەنجامیان دەدەن، بۆیه هەر جۆرێ ململانێ دەکەن، ئاوا خوا تۆڵەتان دەدا.

خاوەن نامەکان و زێدەڕۆیی له شانی عیسادا:

٧. ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ ۚ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ ۖ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ۖ وَلَا تَقُولُوا ثَلَاثَةٌ ۚ انْتَهُوا خَيْرًا لَكُمْ ۚ إِنَّمَا اللَّهُ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ سُبْحَانَهُ أَنْ يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ ۘ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۗ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا﴾ (النساء:١٧١)

ئەی خەڵکانی خاوەننامە! هەڵەڕۆیی و زێدەڕۆیی لەدینەکەتاندا مەکەن، شتێ ڕاست نەبێ ، ئێوە دەربارەی خوا مەڵێن. فەلەکان دەربارەی مەسەلەی عیسا (علیه السلام) زۆر لەسنوور دەرچوون و، گەیاندیانە ڕادەی خواو بەخوا زانین! پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئەفەرموێ: خەڵکینە! لەبارەی منەوە زێدەڕۆیی مەکەن، وەکو گاورەکان دەربارەی عیسا هەڵەڕۆییان کردو ئەوەندەیان پیا هەڵدا، کردیانە کوڕی خوا! بەڕاستیی من تەنها بەندەیەکم، ئێوەش لەوبارەی منەوە هەر ئەوەندە بڵێن کە: من تەنها بەندەو ڕەوانەکراوی خوام (مەسیح کوڕی مەریەم) هەر پێغەمبەری خوا بووە، خوای بەتوانا وشەی خۆی هاویشتە ناو یزدانی

مەریەم و گیانێ کیشە لە خواوە، (جوبریل)ی نارد بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە، ئەویش هەرچۆنی پێی سپێردرابوو کارەکەی ئەنجامدا، وەکوخوا بۆخۆیشی لەسوورەتیکی تردا دەفەرموێ:

مَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ الطَّعَامَ ۗ انْظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ الْآيَاتِ ثُمَّ انْظُرْ أَنَّى يُؤْفَكُونَ (المائدة:٧٥)

مەسیحی کوری مەریەمیش تەنیاو تەنیا پێغەمبەرێك بووەو هیچی تر بەرلەویش بێ سۆ چەند پەیامبەرێ بوون و تێپەڕین ودایکیشی ژنێکی زۆر راست بوو هەردوو وەکو خەڵکی تر خواردنیان دەخواردو پێویستیان بەخۆراك هەبوو، جا ئەگەر خوا بوونایە، چۆن پێویستیان بەخۆراك دەبوو؟ دەسا سەیر بکە و بزانە چۆن ئێمە ئەو هەموو نیشانەو بەڵگانەیان بۆشیی دەکەینەوە؟ دیسانەوە بڕوانەو چاکبزانە دوای ئەوهەموو روونکردنەوەیە چۆن لەئاستیی هەقدا ترازێنران و نەچوون بەلای راستیدا و بەردەوام درۆ هەڵدەبەستن؟ . یان لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ ۖ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (آلعمران:٥٩)

نەقڵی (ئادەم) و (عیسا) لەیەك دەچیٚ:
بەڕاستی مەسەل و نموونەی دروست بوونی عیسایش "کەجێگەی سەرسوڕمانی ئەوانەیە بووەتە جێگەی مشت و مڕیان" هەروەکوو مەسەل و نموونەی دروستبوونی ئادەمە لەلای خوا ئەوەبوو هەر له گڵ قاڵبی بۆ ڕشت و، بیچمەکەی دروستکرد پاشان پێیگوت: ببە! خێرا ئەویش بوو، کەوابوو حاڵی عیسا سەرسوڕهێنەرتر نییە لەحالیٚ ئادەم، چونکە عیسا ئەگەرچی دایکی هەبوو، بەڵام خۆ ئادەم نە باوکی هەبوو ، نەدایك، بەڵکو له گڵ فەراهەمی هێنا، دەسا ئیتر ئەوهەموو مشت ومڕە تان لەچییە؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمویٚ: ئەوی ئەو شایەتیە بدات کە: غەیرە خوا خوایەکی تر نییە شیاوی پەرستن بێت، تاك و تەنیاو بیٚ شەریك و بیٚ هاوبەشە، موحەممەدیش (صلی الله علیه وسلم) بەندەی خوایەو خۆی ناردوویەتی، عیساش بەندەو پێغەمبەری خوایەو ئەو ناردوویەتی و بەبڕیارو فەرمانی ئەوبووەو هاویشتوویەتی پزدانی خاتوونە مەریەم و، ڕۆحێکە لەلایەن خۆیەوەو، ددانیش بنێت بەڕاستی و دروستیی بەهەشت و دۆزەخدا.. ئیتر بیٚ سۆ "کارو کرداری هەرچۆنی بێت" خوای گەورە دەیباتە بەهەشتەوە.

دەسا ئێوە باوەڕ بێنن بەخواو بەپێغەمبەرانی ئەو مەڵێن سێ خوا هەیە، واتە عیساو دایکی مەکەنە هاوبەشی، بۆیە لە سێ ئایەتی تردا دەفەرمووێ:

١. لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ۚ قُلْ فَمَنْ يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَنْ يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ۗ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ

(المائدة:١٧)

عیساییەکان موشریك و کافرن:
بێگومان ئەوانەی گوتیان: خوا خۆی عیسای کوڕی مەریەمەو لەودا جێی بۆتەوە! بێ باوەڕو کافرن ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم) بە نەسارا بڵێ: کێ دەسەڵاتی کەمترین شتی هەیە بەرامبەر بەخوا, تا ڕێ لەبڕیارەکانی بگرێت ئەگەر ویستبای (مەسیح)ی کوڕەکەی مەریەم, و دایکی و هەرچی تریش لەزەویدایە لەناوببات, جائەگەر مەسیح خوا دەبوو- وەکو ئەوان دەڵێن- دە سا بابڕیاری خوا ڕەت بکاتەوە؟ خۆئاشکرایە کە کەسێکی وانییە, کەوابوو ئەوقسە نابەجێ یانەش نەکەن خۆگشت

موڵكايەتی و دەسەڵاتداريێتی ئاسمانەكان و زەوی و هەرچيش لەنيۆانداية هەر بۆخوایە ويستی لەهەر شتێك بێت دروستی ئەكات، بۆيە زۆر ئاساييە عيساش بێ باوك دروست بكا چونكە خوا بەدەسەڵات و بەتوانايە لەسەر هەمووشت .

٢. لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ (المائدة:٧٢)

ئەوانەی دەڵێن خوا خۆی مەسيحی كوڕی مەريەمە، لەدين وەرگەڕاون:

عيساييەكان- ئەوانەيان دەڵێن: خوا خۆی مەسيحی كوری مەريەمە- بێگومان كافرن، چونكە خوا بۆ خۆی تاك و تەنيايەو، (مەسيح)يش هێمان هەر لەبێشكەدا بوو فەرمووی:

قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا [مريم/٣٠]

لەناكاو عيسا(عليه السلام) هاتەگفت و ووتی: بەڵێ من بەندەی خوام، بەدەسەڵاتی خۆی بێباوك دروستی كردووم نامەم پێ ئەداو دەشم كاتە پەيامبەر.

وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنْتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا [مريم/٣١]

له هەرجێگایەکیشدا ببم پیرۆزم دەکا رایشی سپاردووم هەتا ماوم نوێژ بکەم و زەکات بدەم.
وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا [مريم/٣٢]
و چاکەکار وگوێ لەمستی دایکیشم بم نەشی کردووم به زۆردارێکی ملهوڕ.
وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا
[مريم/٣٣]
وه سڵاوو درودی خوام لەسەربێ، رۆژێ لەدایکبووم و، رۆژێ که ئەمرم و، رۆژێکیش زیندوو ئەکرێمەوە.
ذَٰلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ۚ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ
[مريم/٣٤]
قسەی راست: عیسا بەندەی خوایە:
ئەو وەسفکراوە بەم سیفەتانە عیسای کوڕی مەریەم بوو قسەی راستیش دەربارەی ئەو هەر ئەمەیە، کەچی ئەوان تیایدا بەدگومان و دوودڵن، ئەوەتە (نەسارا) به نەفامیی و بێ بەڵگە دەڵێن: کوری خوایە ! جوولەکەکانیش دەڵێن: لەداوێن پیسی پەیدابووە  خوا پەنامان بدات.
مَا كَانَ لِلَّهِ أَنْ يَتَّخِذَ مِنْ وَلَدٍ ۖ سُبْحَانَهُ ۚ إِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ [مريم/٣٥]

خۆهەرگیز بۆ خوا ناوەشێتەوە منداڵی هەبێ، چونکە منداڵ لەگەڵ خوایەتی دا ناگونجێت خوا پاکەو بێخەوشە لەوەی ئەوانە دەیڵێن دەسەڵاتدارێکی وایە، هەرکە ویستی بریاری کارێ بدا تەنها هەرئەوەندەی دەوێ پێی بڵێ: ببە! ئەویش دەست بەجێ دەبێ و، پێویست بە بەکارهێنانی هۆو سەبەب نیە، هەتا سەر لەشێوەی لەدایکبوونی عیسا بکرێتەوە.
وَإِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ

[مريم/٣٦]

بێگومان بن هەر خوایە پەوەردگاری من و، پەروەردگاری ئێوەش، کەوا بوو هەر بەتەنیا ئەو بپەرستن و هاوتا و هاوەڵی بۆ دامەنێن هەر ئەمەیشە ڕێگاو ڕێبازی راست و دروست کە من وەسیەتم بۆ کردن، دەسا ئێوەش بەردەوام لەسەری بچن .
گەڕانەوە سە ر تەفسیری ئایەتەکەی: (المائدة:٧٢)
مەسیحیش کاتێ رەوانە کرا فەرمووی: ئەی نەوەکانی یەعقووب! دەبێ ئێوە هەر ئەوخوایە بپەرستن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە چاك بزانن کە هەرکەسێك شەریك و هاوبەش بۆخوا دابنێ بێ شك خوا بەهەشتی لەسەر یاساغ دەکا جێ و شوێنی ئاگرە.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەیەوە دەفەرموێ:
بەدەر لەموسڵمان کەسی تر ناچێتە بەهەشتەوە.
ستەمکارانیش هیچ جۆرە یارمەتی دەرێکیان بۆ نییەو رزگار نابن.

چەند رێنمایییەك لەم ئایەتەدا:

١- هەمیشە مێژووی یەهوود پڕە لەکاری بەدفەڕو تاوان و قەتڵ و عام.

٢- خوا گەلێ رێزی لەجوولەکە ناوە، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوان زۆر لاسارو لاڕێ و لاساربوون.

٣- ددان نان بەکوفری ئەو تاقمە نەسارانەدا کەدەڵێن: (مەسیح) خوایە.

٤- بەهەشت بۆ هیچ کەسێ نییە هاوبەش بۆ خوا دابنێ.

٣. لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ ۘ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۚ وَإِنْ لَمْ يَنْتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (المائدة:٧٣)

بێگومان ئەو گاورانەی گوتیان: خوا سێ هەمینە لەسێ دانە خواکە، کافرو بێ باوەڕن، گاورەکان دەستەیەکیان دەڵێن: (خوایەتی) دابەشکراوە لەنێوان خواو عیساو مەریەمدا! بۆیە

خواش فەرمووی ئەوانە کافرن ئەم قسانە دەکەن، لەکۆتایی سوورەتەکەدا خوای گەورە بەدرێژی دەفەرمووێت:

يَوْمَ يَجْمَعُ اللَّهُ الرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَا أُجِبْتُمْ ۖ قَالُوا لَا عِلْمَ لَنَا ۖ إِنَّكَ أَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ [١٠٩]

پێغەمبەران پرسیاری قەومەکانیان لێدەکرێت:

لەو ڕۆژە بترسن کە خوا گشت پەیامبەرەکانی خۆی کۆدەکاتەوە ئەوجار لێیان ئەپرسێ و ئەفەرموێ: ئەرێ چۆن وەڵامێکتان درایەوە لەلایەن ئەو گەلانەوە نێردران بۆلایان، کاتێ بانگتان دە کردن بۆ ڕێی ڕاست ؟ جا لەبەر شەرم و ئەدەبی خۆیان و، سەختی رۆژەکە ئەڵێن: خوایە ! ئێمە هیچ زانیارییەکمان لە وبارەیەوە نیە چونکە بێگومان تەنها هەر ئەتۆی کەبە تەواوی لەحاڵی گشت نادیارەکان بەئاگای.

إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَالِدَتِكَ إِذْ أَيَّدْتُكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلًا ۖ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ ۖ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنْفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِي ۖ وَتُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ بِإِذْنِي ۖ وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوْتَىٰ بِإِذْنِي ۖ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَنْكَ إِذْ جِئْتَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُبِينٌ [١١٠]

عیسا! ئەم چاكانەت لەبیر نەچیٚ:
دەبیٚ ئەو بەخشش و بەهرانەتان لە بیربیٚ كەخوای لەكارزان بە عیسای كوڕی مەریەمی داو، پێی فەرموو: عیسا! یادی بەخششەكانی من بكەوە كە بەخشیم بە خۆت و دایكت ئەودەمە كە بە جبریل پشتگیریم لێی كردیت و، بەمەریەمی دایكیشت مژدەمان دا كە لەبەر پاكانە بۆ دایكت و، دەركەوتنی پلەوپایەی بەرزی خۆیشت، هەم بەمنداڵی و لەبێشكەدا، هەم بەگەورەیی ولە هەرەتی دەسەڵاتدا، دەتوانی لەگەڵ ئەو خەڵكانەدا وەڵامی ژیرانە بدە یتەوەو، قسەی پێغەمبەرانە بكەیت. ئەمەیشت لەبیر بێت عیسا! كەمن تۆم فێری نووسین و وردەكاریی و تەورات و ئینجیل كرد وە ئائەمەش كاتیٚ بەفەرمان و یارمەتی من شێوەی پەلەوەرێكت لەقورِ دەنەخشان وساز دەكرد ئینجا فووت پیادەكرد بە فەرمان و دەسەڵاتی من دەبوو بە باڵندەیەك و دەفرِی دیسان وەهەر بە ئیزن و فەرمانی من كوێری زگماك و بەڵەكت چاك ئەكردەوە هەربە كۆمەك و ئیزنی من بوو توانیت مردوو لەگۆرِ دەر بهێنی و زیندووی بكەیتەوە ئەو كاتەیشت لەبیربێت كە دەستی جوولەكەم لیٚ بەدوور گرتیت و نەم هێشت زیانت لێدەن ئەو دەمە كەتۆ ئەوهەموو نیشانە

ڕوونانەت بۆ هێنان جاكا فرو بێ باوەڕەكانیشیان وتیان: ئەمە ببێ و نەبێ جادوویەكی ئاشكرایە.

**وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ أَنْ آمِنُوا بِي وَبِرَسُولِي قَالُوا آمَنَّا وَاشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ** [١١١]

ئەی عیسا! بیری ئەو بەخششەیش بكەوە كە دڵسۆزەكانتم تێگەیاند دەبێ بڕواتان بە من هەبێ و بەپەیامبەرەكەشم, واتە: پشتیوانی لێ بكەن و باوەڕتان پێی هەبێت وتیان: خوایە! باوەڕمان هێنا تۆشایەت بە ، كە ئێمە هەر موسڵمان و گوێڕایەڵی تۆین .

**إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ ۖ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ** [١١٢]

بیربكەوە كە حەوارییە دڵسۆزە شوێنكەوتووەكانت وتیان: ئەی عیسای كوڕی مەریەم! ئەرێ دەكرێ پەروەردگارت لەئاسمانەوە خوانێكمان بۆ بنێرێتە خوارەوەو هەموو جۆرە خواردنێكی تێدابێت؟ عیسا وتی: خەڵكینە! لەخوا بترسن و واز لەو جۆرە قسانە بێنن ئەگەر راستە باوەڕتان بە دەسەڵاتی خوا هەیە.

قَالُوا نُرِيدُ أَنْ نَأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَنْ قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ [١١٣]

ووتیان: ئاخر ئەمانەوێ لێی بخۆین و دڵنیایش ببین لەسەر یەکتاپەرستیی خواو، ڕاستیی تۆ و باشتریش بزانین کە تۆ ڕاستت لەگەڵ کردوین و بش بینە شایەت کە ئەو خوانە بەڵگەی دەسەڵاتی خوایەو، باوەڕیشمان پتەو تر ببێ.

گەڕانەوە سەر تەفسیری ئایەتەکەی: (المائدة:٧٣)

خۆ جگە لەخوای تاك و تەنیا، هیچ پەرستراوێك بۆ پەرستن ناشێ و نییە خۆئەگەر کۆتایی بەو قسانەیان نەهێنن ئەوا لەرۆژی سەلادا سزایەکی ئێش پێ گەیەنەر، تووشی ئەوانەیان دەبێ لەدین لایانداوە.

گەڕانەوە سەر تەفسیری ئایەتەکەی: (النساء:١٧١)

واتە: ئەوانەی کە گوتیان خوا سێ هەمینە لەسێ خوایان، بێگومان لەدین لایانداوە، جگە لەخوای تاك و تەنیا هیچ کەس بۆپەرستن ناشێ، وە دەربارەی ئەوانەش پێیان وابوو خوابوو فەرمووی کۆتایی بەو قسانە بێنن، بۆ ئێوە باشترە بێ شك هەر (الله) تاکە خوایە پاك و بێخەوشە لەو تۆمەتە کە: منداڵی هەبێ هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەوییدایە هەرهی ئەوە وخواش هەر خۆی بەسە بۆپێکهێنانی کاروبارو،

بەڕێوەبردنی بوونەوەر، هیچ پێویستییەکی بەعیساو خەڵکی تر نی یە.

ئەی خاوەن نامه کان قورئان نوورو ڕووناکییه:

٨. ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِمَّا كُنْتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ ۚ قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ﴾ (المائدة:١٥)

ئەی خاوەننامەکان! بەڕاستی پەیامبەرمان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) هاتەلاتان زۆرێ لەوەی کەئێوە لەنامەکەتاندا دەتان شاردە وە ئەو دەریدەخات بۆتان، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ وَهُمْ مُعْرِضُونَ (آل عمران: ٢٣)

خاوەن نامەکان حوکمی خوایان قبووڵ نەبوو!:

ئاخۆ ئەوانەت نەدیتووە کە بەشێکی گەورەیان لە کتێبی تەورات و ئینجیل پێدرابوو کە هەربانگ ئەکران بۆلای کتێب و نامەکەی خوا، واتە: (تەورات) و، (ئینجیل) هەتا ئەو کتێبە بڕیاری راستەقینە بدا لەنێوانیانداو داوەرییان بکا

کەچی دەستەیەکیان روو وەردەگێڕن و پێی رازی نابن و هەر سەرپێچی دەکەن" دەبێ خوێندە وار پەیرەوی هەر لەراستیی بکات، ئەگەرچی زیانی خۆشی تیا بێت.
وه بەشی لەوەی دەیانشاردەوه ناونیشان و سیفاتی پەیامبەر بوو (صلى الله علیه وسلم)، وه له سورەتی بەقەرەداخوای گەوره دەفەرموویت: قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ [٩٧]

جوولەکه جبریل بەدوژمنی خۆیان دەزانن!:
پێشەوا (ئەحمەد) له(ئیبن عەبباس)ـەوه -خوا لێیان رازیی بێ- دەڵێ: تاقمێ لەجوولەکه ڕوویان له پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)کردو ووتیان: ئەبەلقاسم! ئێمە پێنج شت له تۆ دەپرسین، جائەگەر تۆ وەڵامت داینەوه، ئەوا باوەڕدەکەین تۆ پێغەمبەریت و, پەیڕەویشت لێدەکەین، ئەوجا وەك (ئیسرائیل/ یەعقووب) بەڵێنی لەکوڕەکانی خۆی وەرگرت، لەبارەی (یوسف)ـەوه (علیه السلام) بەڵێنیان داو ووتیان: ( الله على مانقول وكيل ) پێغەمبەریش (صلى الله علیه وسلم)هەروا بەڵێنی دانێ و بۆی دووپات کردنەوەو، فەرمووی: دەسا پرسیارەکانتان بڵێن: ئەوانیش وتیان:

نیشانەی پێغەمبەرێتی چییە؟ فەرمووی: پێغەمبەر هەردووچاوی دەنوێن ، بەڵام هەرگیز دڵی نانویێ ولەخوا خافڵ نابیێ پاشان ووتیان: ئەی ئەو تنۆکە ئاوە کە دەچێتە منداڵ دانەوە؛ چۆن جاریێ دەبێتە مێیینە، جارێکیش دەبێتە نێرینە؟ فەرمووی:کەهەردوو ئاوەکە لەجێی خویاندا بەیەك دەگەن ، ئەگەرئاوی پیاوەکە سەرکەوت بەسەرئاوی ژنەکەدا ، ئەوە کوڕی دەبیێ و، خۆ ئەگەرئاوی ژنەکە سەرکەوت بەسەر ئاوی پیاوەکەدا، ئەوا کچی دەبیێ. وتیان: دەباشە! یەعقووب چ شتێکی لە خۆی قەدەغە کرد؟ فەرمووی: کاتی خۆی یەعقووب (علیه السلام) تووشی (عەرقوننەسا)بوو، بێجگە لە شیری (وشتر)یش شتێکی تری بۆباش نەبوو، ئەوجا لەبەرئەوە کە وشترەکە بمێنێتەوەو سەرنەبڕدریێ، گۆشتەکەی لەخۆی حەرامکرد، وتیان: راست دەکەیت. وتیان باشە ئەی ئەو (رەعد) ودەنگە لە هەورەکانەوە دێت چیە..؟ لەوەڵامدا فەرمووی: خوا فریشتەیەکی هەیە؛ کاروباری گشت هەورەکانی پیێ سپێردراوە، ئەو (رەعد) وبروسکەیش ئێوە دەیبینن و دەیبسن، دەنگ و نەعرەتەی فریشتەکەیە. وتیان: راست دەکەیت، بەڵام تەنیا پرسیارێکمان ماوە، ئەگەر بەراستیی وەڵامیمان بدەیتەوە، ئەوا پەیمان و

بەیعەتت دەدەینیٚ وباوەرت پیٚ دێنین، پرسیارەكەیش ئەمەیە: هەر پێغەمبەرێك فریشتەیەكی وەحی هاتۆتە لایی و وەحی بۆهێناوە، باشە ئەو فریشتەیەی وەحیی بۆتۆ دێنی كێیە؟ فەرمووی: (جوبریل)ـە(علیه السلام). وتیان: جوبریل! ئەوجوبریله كه دەستووری جەنگ وكوشت و كوشتار دەدا ؟! خۆ ئەوە دوژمنی ئێمەیە، ئەگەر لەباتی ئەوە گوتبات میكائیله كه رەحمەت وباران و سەوزایی دێنیٚ، قبوولْمان بوو، ئەوسا خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە و فەرمووی: ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)! پێیان بلْیٚ: هەركه سێك خۆی به دوژمنی جوبریل دەزانیٚ، دەبا له خەم وخەفەتدا بمریٚ، چونكه بێگومان ئەوە بەفەرمانی خوا ئەم قورئانەی دابەزاندووە بۆسەر دلْ ودەروونی تۆ، ئیتر با جوولەكه هەر رقیان لێی بیٚ و دوژمنایەتی لەگەلْ بكەن، وەك خۆیان هاوار ئەكەن و ئەلْێن: جوبریل دوژمنی ئێمەیە..؟! ئەو قورئانەش ئەودەیهێنیٚ ،پشتگیری له كتێبەكانی بەردەستی دەكا، بەتەوراتەكەی ئەوانیشەوە وەرێنمایی وموژدە یشه بۆ برواداران، كەوابوو بروا نەبوونی ئەوانە بەقورئان ئەر هەر لەبەر ئەوە بیٚ كه جوبریل هێناویەتی، ئەوە شتیكی زۆرخراپ ونارەوا و ناماقولْە.

مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ [٩٨]

هەركەسێك دژومنی خواو فریشتەو پەیامبەرەكانی ئەو و جوبریل ومیكائیل بێت، ئەوەبێ سۆ كافرو بێ باوەڕە لەبەرامبەر ئەوەیشەوە، بێگومان خوا ناحەزو دوژمنی بێ باوەڕانەو، مامەڵەی دوژمنایەتیان لەگەڵ دەكات، چونكە هەركەسێك دوژمنایەتی لەگەڵ دۆستەكانی خوادا بكا، وەك دوژمنایەتی لەگەڵ خودی خوادا كردبێ وایە.

وە هەروەها حاشاشیان لەوە دەكرد كە خوای كارجوان بەهۆی لاری ئەوانەوە بووبێ كە هەندێ خواردنی حەڵاڵ و خاوێنی لەسەر حەرامكردبن, وەك لەسوورەتی (نیساء) دا دەفەرمووێت: فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ كَثِيرًا [١٦٠]

لەبەر ناهەقیكاری جوولەكە نازو نیعمەتێكی زۆریان لەسەر حەرام كرا:

لەبەر ئەوستەم و ناهەقیەی جوولەكە كردیان، چەندین شتی حەڵاڵ و ڕەوامان لەسەر قەدەغە كردن و بێ بەشبوون لێی وە لەبەرئەوەش كە زۆركەسیان لەڕێگەی خوا وەرگەڕان وڕێیان لێگرت، وەك لەسوورەتی ئالی عیمران دا دەفەرمووێ:

كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ [٩٣]

هەموو جۆرە خواردەمەنییەك بۆ کوڕان و نەوەی ئیسرائیل ڕەوابوو، بێ لەوەی کە ئیسرائیل (یەعقوب) پێش هاتنی تەورات خۆی لێ لاداو پارێزی لێکرد، ئەوسا ئەمانیش لەبەر ناهەقیی خۆیان گەلێ رزق و رۆزییان لێگیرایەوە، وەك لە سورەتێکی کەدا خوای گەورە د فەرموویێ: وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ ۖ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَا أَوْ مَا اخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ۚ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِبَغْيِهِمْ ۖ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ

(ئەنعام: ١٤٦)

واتە: ئێمە گشت زیندەوەری نینۆك دارو پیوی گاو مەڕمان لەمووساییەکان قەدەغە کرد، پیویێ نەبێ بەپشت ئەوانەوە بێت، یان لەگەڵ ریخۆڵەکانیان بێ، یان ئەو پیوە تێکەڵ بە ئێسکیان بووبێت، ئەو تۆڵەیەش چونکە ناهەقبوون و لەرێی راست گلابوون و لایاندا، بێ سۆ ئێمە ڕاست دەکەین.

وە دەشیانگوت: هەرشتێك بۆ یەعقووب حەرام نەبووبێت بێگومان لەسەر ئێمەش حەرام نەبووە، کەچی قورئان بەدرۆیان دەخاتەوە، و دیسان گاورەکانیش موژدەکەی عیسایان بەهاتنی

پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) شاردەوە، وەك خوای گەورە لەسورەتی (صف)دا دەفەرموویت: وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَاءَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ مُبِينٌ [٦]

عیسا (علیه السلام) مژدەی هاتنی پێغەمبەر دەدات: وەبیریان بێنە كاتێ كە عیسای كوڕی مەریەم وتی: ئەی نەوەكانی یەعقوب! بێگومان من پێغەمبەرو نێرراوی خوام بۆلای ئێوە ددانیش بەو تەوراتەدا دەنێم لە بەردەستم دایە مزگێنیش بە هاتنی پەیامبەرێك دەدەم - كەپاش خۆم دێ - ناوی (ئەحمەد)ـە، لە فەرمودەدا هاتووە كەیەكێ لە ناوەكانی ئەو پێغەمبەرە (ئەحمەد)ـە (صلی الله علیه و سلم) جا كاتێ عیسا یان موحەممەد بە موعجیزە روونەكانەوە هات و پێی ڕاگەیاندن ووتیان: ئەمە جادویەكی ئاشكراو نمایانە ! .

گەڕانەوە بۆ سەر تەفسیری ئایەتەكەی:(المائدة:١٥)

وە لەزۆرێكیشی بێ دەنگ ئەبێ و چاوپۆشی ئەكا بێگومان لەلایەن خواوە نوورو نامەیەكی ئاشكراو ڕوون هاتەلاتان.

ئەی خاوەن نامه‌کان باوەڕ بهێنن به محمد (صلى الله عليه وسلم)که پێغەمبەری کۆتا زەمانەو لەپاش ئەو پێغەمبەری تر نایەت.

٩. ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَى فَتْرَةٍ مِنَ الرُّسُلِ أَنْ تَقُولُوا مَا جَاءَنَا مِنْ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ۖ فَقَدْ جَاءَكُمْ بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ ۗ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (المائدة:١٩)

ئەی خاوەن نامەکان! ئەوا پەیامبەری ئێمە محمد(صلى الله عليه وسلم) هاته لاتان و، دەبێته پێغەمبەری هەموان و، دەبێ گشت باوەڕی پێ بێنن و، پەیڕەوی لێ بکەن پاش ماوەیەك که زنجیرەی پەیامبەران بچراو نەهاتن، وائێستا ئەم پێغەمبەره دێته لاتان و، باسی ئەوماوەیەتان بۆ روون دەکاتەوە، واته: ئەو ماوەی (٦٠٠) شەش سەد ساڵه -وەکو هێندێ دەڵێن- که زنجیرەی هاتنی پەیامبەرانی تیاپچڕاو نەنێردران، ئەم پەیامبەره نوێیه دێتەلاتان و، سەر لەنوێ بەرنامەتان بۆ نوێ دەکاتەوەو لەرابوردو بەئاگاتان دەکات، پێغەمبەر خۆی (صلى الله عليه وسلم) ئەفەرموێ: بەڕاستیی من له هەموو کەسێك بەکوڕەکەی (مەریەم)ـەوە عیسا(عليه السلام) نزیکترم، چونکه لەنێوانماندا هیچ پێغەمبەرێك نەبووە.

لەبەرئەوه کە لەڕۆژی دواییدا نەڵێن: لەخواوه هیچ مژدەدەرو ترسێنەرێکمان بۆنەهات دەسا ئەوا مژدەدەرو ترسێنەرتان هاتەلا، ئیتر هیچ بیانوویەکتان نەما خوایش بەسەر هەمووشتێکدا دەسەڵاتدارەو دەتوانێ تۆڵەی یاخییان بداو، پاداشی بەرفەرمانان مسۆگەر بکات.

---

١٠. ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ هَلْ تَنْقِمُونَ مِنَّا إِلَّا أَنْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَاسِقُونَ﴾

(المائدة:٥٩)

خاوەن کتێبەکان ڕقیان لە ئیمانداره‌کانە:

بەوخاوەن نامانەی کە -گاڵتە بەنوێژ دەکەن- بڵێ: کە مەسخەرە دەکەن و تانەو توانج دەگرن، مەگەر هەر لەبەرئەمە نییە کە ئێمە باوەڕمان هەیە بەخواو، بەوقورئانە نێردراوەتە لامان و، بەوکتێبانەش پێش ئەم قورئانە نێردراون و دەشزانین کە بێگومان بەشی زۆرتان لە سنوور دەرچوون و لاتان داوە، بۆیە ئاوا ڕێ بە بەختی خۆتان نابەن؟ .

---

ئەی خاوەننامەکان! ئێوە لەسەر هیچ بەرنامەو ئاینێکی دروست و رەوان نین.

١١. ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَى شَيْءٍ حَتَّى تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ ۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا ۖ فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ (المائدة:٦٨)

بڵێ: ئەی خاوەن نامەکان! ئێوە لەسەر هیچ بەرنامەو ئاینێکی دروست و رەوان نین هەتا بەپێی تەورات و ئینجیل و ئەوی لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتووە نەجوڵێنەوە، واتە: دەبێ ئیقامەی تەواوی کتێبەکانی خوا بکەن بێگومان لەباتی گوێڕایەڵی لەو قورئانەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت هات ئەی پێغەمبەر! (صلی الله علیه وسلم) زۆرێکی خاوەن نامەکان سەرکەش ترو بێ باوەڕتر دەکا دەسا تۆش بۆ گەل و کۆمەڵی بێ باوەڕان هەرکە بڕواناهێنن، غەمبارو دڵغەمگین مەبە .

خاوەن نامەكان لە شیرك دانان بۆ خواو ، زیادەڕۆیی لەدیندا:

١٢. ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ غَيْرَ الْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوا أَهْوَاءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا مِنْ قَبْلُ وَأَضَلُّوا كَثِيرًا وَضَلُّوا عَنْ سَوَاءِ السَّبِيلِ﴾ (المائدة:٧٧)

ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)! بەخاوەن نامەكانی (نەسارا) بڵێ: كاری ناڕەواو زیادەڕۆیی لەئایینی خۆتاندا بەناهەق مەكەن، مەڵێن: عیسا خوایە، یان كوڕی خوایە و مەكەونە شوێنی هەواو ئارەزووی ئەو جوولەكانەش كەهەر بەرلە هاتنی ئەم پەیامبەرە، گومرابوون و دەیانگوت: عیسا زایینەی زینایە! و خەڵكێكی زۆریشیان لەڕێ گومڕا كردو لەخشتە برد وخۆشیان لەڕاستە ڕێگە گومڕاو كلابوون و دووركەوتنەوە.

تەواوبوو بە پشتیوانی خوا........

کەوابوو ئەی خاوەن نامەی بەڕێز ووریابەو ئاگاداربە گەر شوێنی ئەم پێغەمبەرە پایەبەرزو کۆتاییی یە نەکەویت ئەوا بێگومان لە دوارۆژدا لە زەرەر مەندان دەبیت،بەم شێوەیە هاتینە کۆتایی پایانی ئەم بانگەشە خوایی یەی کەوا لە باوکمان ئادەمەوە(علیە السلام)ە وە تاوەکو سەروەرمان و خاتەم محمد(صلی الله علیە وسلم) پێغەمبەرانی ناردووە تاوەکو لەسەر زەوی دا خوا بە یەکتاییی و بە بێ هاوتا بپەرسترێت و خەڵکی رزگار بکەن لە بەندایەتیکردنی بەندە بۆ بەندایەتیکردنی خوای تاك و تەنها.

تێبینی:

لە کۆکردنەوە ی ئایەتەکان دا سوودمەند بووم لە تەفسیری ڕامان و بەرنامەی دەنگی قورئان خوای گەورە پاداشتی خێری هەموو لایەك بداتەوە.

برای بچوکتان: باوکی ئەسماء

rangshexany@yahoo.co.uk

(وسبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله الا أنت استغفرك وأتوب اليك)